**الحمد للّٰه رب العالمين، والصلاة والسلام على أفضل الأنبياء والمرسلين، وآله وصحابته أجمعين، ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.أما بعد،**

**لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين ، لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين، لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين اللهم أحسن عاقبتنا في الأمور كلها وأجرنا من خزى الدنيا وعذاب الآخرة**

**لە قەولێکی ابن قیم** ﴿رَحِمَهُ اللهُ﴾ دەبین ئەم ئیمامە بەرێزە باسی وتەیەکی زۆر گرینگمان بۆ دەکات لە کتێبی (طريق الهجرتين [قاعدة تخلف كمال العبد وصلاحه من جهتين]) ئەو کەسەی ئەیەوێت خاوەن ئیمانێک و دڵێکی تەواو بێ، خاوەن عیلمێکی تەواو بێ، خاوەن ئیخلاصێکی تەواو بێ، خاوەن تەقوایەکی تەواو بێ، خاوەن عبودێتێکی تەواو بێ، بەراستی ئەو بەندە بێ کە خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ لە وەسفیان دەفەرمووێت:﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ﴾ ، ﴿وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ﴾ چۆن خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ وەسفی ئەم پێغەمبەرانە دەکات بە کەلیمەی بەندە بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ لەوانمان بکات وەک ابن قیم ﴿رَحِمَهُ اللهُ﴾ دەفەرمووێت: ئەو کەسەی کە پێی خۆشە خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ پلەیەکی تەواوی

پێی بدات لە هەموو ڕوویەکەوە لە ئیمانی لە ئیخلاصی لە عیبادەتی لە هەڵسوکەوت و دانیشتنیدا هەتا لەگەڵ دایک و باوک و خێزان و کەس و کاری و چواردەوریدا یەکەم شت ئەوەیە دەبێ ئەم بەندەیە خۆی بنا سێت و بزانێ ئەم بەندەیە، وە بزانێ مانای بەندە چیە؟ خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ حیکمەتی هەیە کە وشەی بەندەی بەکارهێناوە، وە وایشی بە پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ فەرمووە، کەسێک کەوا ئەقڵێکی جوان لە مێشکیدا بێ، وە ئەقڵەکەی توانای ئیش کردنی هەبێ، بڕوات پێناسەی بەندە بخوێنێتەوە و وە بزانێ ئەو پێناسەیە خۆی دەگرێتەوە بە بێ ئەوەی هیچ کتێبێکی تر بخوێنێتەوە، بیەوێت ببێتە کەسێکی موتەقی، کەسێکی ڕاستگۆ، کەسێک کەوا هەستکا کە لە زەوی و ئاسمان لەو فەقیر تر نیە، پاشان لەم ئایەتەی خوای پەروەردگار﴿جل وعلا﴾ تێدەگات﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿١٥﴾ ﴾، کاتێک کە ئەو ئایەتە دەبیستێ زۆر گریانی دێت بۆ ئەوەی زۆر جار بێ ئاگابووە لەوەی کە خۆی بە فەقیر نەزانیوە، بۆیە داوای لە خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ نەکردووە، تەسلیمی نەبووە لە عیبادەتیدا، لە قسە و کردەویدا، لە کڕین و فرۆشتنیدا، لە هەموو کارێکیدا، بەڵام کاتێک تۆ دەزانی بەندەیت ئەم بەندەیش لە هیچەوە دروست بووە، تۆ



بەبێ خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ هیچ نیت ئەم پێناسەیە لەسەرت لانـاچێ، ئەو کاتە تۆ بەنـدەیەکی ڕاستگۆ و بەهێزی موتەقی و بە توانایت ئەتوانی شـت بکەیت کە خۆت بە بەندەی خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ بزانی، بەڵام هەر کات لە بەندایەتی چویتە دەرەوە وابزانی بەبێ خوای گەورە دەتوانی شـتێک بکەیت ئەوا خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ فەرمووی: (من تعلق شيئا وكل إليه ) ئەو کەسـەی کەوا چاوەزارێک بە ملی خۆی یان سـەیارەکەی یان منداڵ و ماڵەکەی دەکات گومانی وایە کە ئەمە دەیپارێزێت لە چاو لە ناخۆشی و لە نەخۆشی پێغەمبەر ﴿صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ فەرمووی خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ تەسـلیمی ئەو شـتەی دەکات با بتوانی سـوود و قازانجێکت پێی بگەیەنێ، بۆیە کاتێک پێغەمبەر ﴿صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ زانی مانای بەندە چیە ئەویش بەندەیە، دەبینین لە هەموو کەس خاشـع تر بووە، لە هەموو کەس زەلیل تر بووە، بە قەدەر ئەوەی مرۆڤ بزانێ کە بەنـدەیە ڕۆژ بە ڕۆژ زەلیـل تر دەبێ بەقەدەر ئەوەی بزانی کە بەندەیە ئەم وشـەیە بۆیە زۆر دەیڵێمەوە بۆ ئەوەی نەفسـمان بشـکێتەوە پەروەردە بین، ئەگەر تۆ سـەیری خۆت بکەی سـکت بەردەوام پڕ پیسـاییە ناتوانی خۆتیش بگریت کە ئەم پیساییە نەکەی وە نایشتوانیت بیکەیت ئیلا مەگەر خوای پەروەردگار

﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ یارمەتیت بدات، ئەوە هەموو پێناسەی تۆیە، دەی باشە چۆن دژایەتی خوای ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ دەکەیت؟ چۆن داوا لە غەیری خوای ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ دەکەیت؟ چۆن زینا دەکەیت؟ چۆن ئارەق دەخۆیتەوە؟ چۆن دزی دەکەیت؟ چۆن زوڵم لە دایک و باوک و خێزان و موسڵمانان دەکەیت؟ چۆن ئەم هەموو گوناهە دەکەیت؟ تۆ بەندەیەکی ناتوانی پیسایەک بکەیت ئەگەر خوای ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ یارمەتیت نەدات، تۆ ئەزانیت ئەم بەندە چەندە پێویستی بە خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ هەیە، هەرچی نوقسانی هەیە لەم بەندەدا هەیە، بەیەک سەرئێشە ئەکەوێت، هەر عەمەلیاتێکت بۆ دەکرێت دەبێ بە مانگ بکەویت توانای هیچت نامێنێت، یەک پەنجەت بشکێت ئەوا دەستت توانای هیچی نامێنێت، یەک دەمار کە پێی دەوترێت حەبلی شەوکی ببچرێت لاشەت نیوەی لەکار دەکەوێت، ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾ رێز و قەدری خوای گەورەیان وەک پێویست نەگرت و نەزانی، ئەمە بۆ کەسێکە کە بیر بکاتەوە کە خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ بە بەندە درووستی کردوە، کەواتە ئێمە بەبێ خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ هیچ نین، ئایە ئەم قسانە تەنها بۆ کەسێکی لاوازە یان هەتا پێغەمبەرانیش دەبێ بیرو باوەڕ یان وابێ، بۆیە پێغەمبەری خوا﴿صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ﴾ دەفەرمووێت: **(یا حي یا قیوم برحمتیك**



**أسـتغيث)** خوايە بە عيلمەکەم هاوارت لێ دەکەم، بە ماڵەکەم بە سـەيارەکەم بە ئیشـەکەم بە هەموو کاروبارێکی ژیانم پەنات پێی دەگرم، باشـە خۆ کەس لە پێغەمبەر محمد ﴿ﷺ﴾ بەهێز تر نەبوو، کەسـیش لە پێغەمبەر موسـا ﴿عليه السلام﴾ بەهێز تر نەبوو، کەسـیش لە پێغەمبەر عیسـا ﴿عليه السلام﴾ بە هێز تر نەبوو، کەسـیش لە پێغەمبەر نوح ﴿عليه السلام﴾ بەهێز تر نەبوو، سەیری دوعایەکانیان بکەین ئینجا فێر دەبین کە تەوحید چەندە گرینگە هەتا نەزانیت بەندەیت ملکەچی خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ نابیت، کاتێک کە زانیت بەندەی بە ناچاری بێ یان بە خۆشی بێ ڕاستەوخۆ دڵت یەکلا دەبێتەوە بۆ خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ ، هەموو داوایەکت لە خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ دەبێ، سـەیری ئەوە نـاکەیـت لە سـکی حوتیـت یـان لە دەرەوەی حوتیـت ئەزانی کە تۆ بەندەیت لە دەرەوە بێت یان لە ژوورەوە بێت بە بێ خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ هیچ بەهـایەکـت نیە، هیچ توانـایەکـت نیە، هیچ هێز و جوڵەیەکـت نیە، نە سـەردەکەویـت نە دەتوانی چـارەسـەری خۆت بکەیت، بۆیە پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: **(یا حي یا قیوم برحمتيك أسـتغيث)** پەروەردگار محمد هاوار دەکات بۆ ڕەحمەتی تۆ، هەر چەنـدە محمـد ﴿ﷺ﴾ بەهێزترین و بە توانـاترین و زانـاترین

پێغەمبەر بێ هەر پێویستی بە تۆیە، لەکاتێکدا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەستی بەرز دەکاتەوە دەفەرمووێت: **(اللهم آت ما وعدتني، اللهم إن تهلك هذه العصابة من أهل الإسلام لا تعبد في الارض)** پەروەردگار ئەگەر جێشی بەدر لە ناوبچێت لەسەر زەوی تۆ ناپەرسترێت، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە شێوەیەک دەست بەرز دەکاتەوە کە بن باڵی بە دیار دەکەوێ ئەبو بەکر ﴿رضي الله عنه﴾ بەزەیی پێیدا دێتەوە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەزانێ کە بەندەیە، بەندەیەیش بەبێ پەروەردگار پێی لە شوێنی خۆی ناجوڵێت، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ باش دەزانێ کە بەبێ پەروەردگار یەک هەناسەیش ناتوانێ بدات یەک هەناسەیش ناتوانێ هەڵمێژێتەوە ئیلا دەبێ ڕەحمەتی خوای پەروەردگاری ﴿جل وعلا﴾ لەسەر بێ، ئەزانێ بە بێ خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ ناتوانێ لە جێگای خۆی هەڵبسێت و دانیشێتەوە، باش دەزانێ ئەگەر خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ ڕەحمی پێنەکات و سەری نەخات ئەوا توانای سەرکەوتنی نیە بەسەر هیچ جێشێکە. تۆ ناتوانی بەبێ خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ دەوڵەمەند بی، ژن بهێنیت، تۆ ناتوانی بەبێ خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ نەخۆشی خۆت چارەسەر بکەیت، ناتوانی خانوو دروست بکەیت، تۆ ناتوانی بەبێ فەرمانی خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ بۆ خۆت بژیت، کاتێک کە



وشـــەی ناتوانی دەبیســـتیت با ئەمە ببێتە ئەقیدەت و لە مێشـــکت بچەســـپێـت، پێنـاســـەی تۆ هیچی کوڕی هیچی کوڕی هیچە، ئەوە پێنـاســـەکەی تۆیە، هیچـت نیە بە بێ خوای پەروەردگـار ﴿جل وعلا﴾ هیچ تیش نـابێ و هیچ تیش پێی نـاکرێـت، **:(یا حي یا قیوم برحمتیك أســتغیث أصــلح لي شــأني کله)** ئیلا دەبێ وەک پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ بڵێیـت: هەرچی کـارم هەیە پەروەردگـارە بەس تۆ ئەتوانی جێ بـە جێ بکەیت، بۆ پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ نەی فەرموو هەندێک لە ئیشـــەکانم بە تۆ دەسپێرم خۆم توانای هەندێک ئیشی ترم هەیە دەتوانم جێ بە جێ بکەم، هەموو کارێک دەبێ ئیلا بۆ لای پەروەردگار بگەرێتەوە ئەگینا بەخەســـارمەندی دەمێنیتەوە، ســـەیری ئەوە مەکە کە دەکرێیتە ناو دەریاوە وەک پێغەمبەر موســـا ﴿عليه السلام﴾ بە منداڵی خرایە ناو تابوکێك خرایە ناو دەریاوە پەروەردگار پاراســـتی و ناردی بۆ ماڵی دوژمنەکەی، ســەیری ئەوە مەکە کە منداڵ بە کۆرپەلەی ناتوانی قســە بکات وەک پێغەمبەر عیسا ﴿عليه السلام﴾ ئەی عیسا ئەگەر تەوحیدت هەبێ ئەی مەریم ئەگەر پشـــت بە من ببەســـتە من وا لە منـداڵەکەت دەکەم لەنـاو پێشـــکەدا قســـە بکات ﴿وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ﴾، ســـونەتی من وایە، دەســـەڵاتی من ئەی بەنـدەکەم وەک تۆ نیە، فەرمـانی من بەقەدەر



ئەوەی چاوت بکەیتەوە و دای بخەیت کارەکەت بۆ ئەنجام دەدەم ﴿وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ ۝٥٠﴾، زۆرجاریش پەروەدگار کە کارەکانت دوا دەخات حەز دەکات گوێبیستی دوعاکانت بێ، خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ دەفەرمووێت: ئەی بەندەکەم دەمەوێ داوام لێ بکەیت بەڵام داوا کردنێک دەبێ یەقینی لەگەڵدا بێ نەوەک داوا کردنەکەت بە زمان بێت و دڵتیش لە شوێنێکی تر بێ، پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ فێرمان دەکات ئەگەر ئەو تەوحیدەمان هەبێ بەسمانە بەڵام هۆکاریش دەگرینەبەر، سەیری پێغەمبەران بکەین دوای ئەوەی ئیشەکەیان کرد دوای ئەوەی کە توانایەکی زۆریان هەبوو لەهەمان کاتیشدا هەمیشەیش فەرموویانە ﴿وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ۝٤٤﴾، پەروەردگارە هەرچی ئەقل و عیلم و توانا و بەرنامە و توانای زەواج و ئیش و شەڕکردنم هەیە هەمووی تەسلیمی تۆ دەکەم، وەک پەروەردگار فەرمووی ئەی محمد ئەگەر تۆ ورەت بەرز بێ و پشتت بە من ببەستی ناوت بەرز دەکەمەوە تەوحیدەکەت بەرز دەکەمەوە شوێنکەوتووەکانت بەرز دەکەمەوە هەتا نەبیتە بەندەی من هەرگیز گەورە نابیت، وەک پێغەمبەر ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾

دەفەرمووێت: (يحشـــر الجبارون المتكبرون يوم القيامة في صـور الذر، يطؤهم الناس لهوانهم على الله تعالى) لە قیامەتیشــدا خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ تاغوتەکان لەســەر شــێوەی زەرە حەشریان دەکات ئەکەونە ژێر دەســـت و پێی خەڵکی (لهوانهم على الله تـعالى) لەبەر ئەوەی هیچ قیمەت و ڕێزێکیـان نیە لای خوای پەروەردگـار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ ، بۆیە ئەو بەندەی کە ئەیەوێت بەبێ خوا بژێت وە بۆ خوا نەژێت ، چەند دەتوانم لە ژیـانـدا بێ خوا بەبێ معبود بژێم، کە مەخلوقم چەنـد دەتوانم بەبێ خـالقم بژێم، کە زەعیفم چەنـد دەتوانم بەبێ القوی بژێم، کە فەقیرم چەنـد دەتوانم بەبێ الغنی بژێم ، بێگومـان مەحـاڵە نـاتوانیـت بەبێ خوای پەروەردگـار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ بژێیـت، کـاتێـک کە ئەم ئەقـیـدەیە لە دڵـت جـێـگـیـر بـوو ئەوا ڕاســـتەوخـۆ دەڵـێـی:

﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ پـاکـی بـۆ تـۆ پەروەردگارم ئەگەر ڕۆژێک گەشتبێتمە کەسێکی گەمژە کە بەبێ زاتی تۆ بڵێم: ئەتوانم بژیم، ئەتوانم نوێژ بکەم، ئەتوانم ڕۆژوو بگرم، ئەتوانم بنوســم، ئەتوانم دەوڵەمەنـد بم، ئەتوانم ژن بهێنم، نـا تۆ بەنـدەی هیچ توانـایەکـت نیە، فەقەد ئـامێرێکیـت بە فەرمـانی خوا دەجوڵێیت و دادەنیشــیت و ئەڕۆیت، وەک لقێکی دار وایات کەی

پەروەردگـار بیەوێـت ئەت جوڵێنێـت کەی بیەوێـت لە دارەکەیش ئەتکـاتەوە، کـاتێـک خوا بە پـاک ئەزانی، کـاتێـک خوا بە گەورە ئەزانی ئەگەر خۆت بە بەندە زانی ئەمەیش دەبێ بە کردەوە بیســەلمێنیت، وەک پـێـغەمـبەر مـوســـا ﴿عليه السلام﴾ فەرمـووی:﴿ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾ پەروەردگـارە من زۆر فەقیرم بەو شــتەی کە دات بەزاندووە، بە بێ زاتی تۆ موســا چی پێدەکرێت ، موســایەکی فەقیر ئەگەر هاتوو ڕەحمەت و قوەت و قودرەت و دەسەڵاتی خوای پەروەردگـاری ﴿جل وعلا﴾ لەگەڵـدا نەبـێ چـی پـێـدەکـرێـت، بەڵام خـوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ دەفەرمووێت: بەندەکەم ئەگەر بەندایەتیت کرد بۆ من ســەیری ئەوە مەکە پێشــت بەحرە، ســەیری مەعبودەکەت بکە، ســەیری ئەوە مەکە گۆچانێکت لە دەســتە ئەم گوچانە قوەتی خوای القویە، ڕەحمەتی خوای ڕەحمانە، تەنها ئەوەندەت لەسەرە کە لە ناخد دا بە یەقینەوە بڵێیت: (لا اله الا أنت القوي ، الا أنت الجبار) بەس تۆ ئەتوانی ئاسمان شەق بکەیت، زەویم بۆ شەق بکەیت، ئەتوانی زەوی شــەق بکەیت قارون بکەیت بە ناخی زەویدا، ئەتوانی بحرم بۆ شــەق بکەیت فرعەون غەرق بکەیت، پەروەردگار ئەم شــتانە وای لە من کرد ببمە بەندەی تۆ، وە تۆیش بکەم بە مەعبودی خۆم، کاتێک پێغەمبەر

ئەیوب ﴿عليه السلام﴾ دانی نا بە تواناى پەروەردگار، کە بەندەیەکی زەعیفە هەژدە ســاڵ نەخۆش بوو وەک پەروەردگـار ﴿جل وعلا﴾ دەفەرمووێـت:

﴿وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ﴾ پەروەردگار نەی فەرموو (واذكر النبينا) چونکە پلەی عبودیەت گەورە ترە لە نبوەت و هەتا بەندە نەبیت نابیتە نەبی، هەر کـاتێـک وتـت بەنـدەم بەردەوام دەبێ هەســـت بە زەلیلی بکەیت، بەردەوام زەبونیت، بەردەوام خاشـعیت، بەردەوام فەقیریت. قەد بە مێشـکدا نایات تەکەبورت هەبێ، قەد بە مێشـکدا نایات ڕیا بکەیت، قەد بە مێشـکدا نایات بە خۆت سـەرسـام بیت، بۆ؟ چونکە ئەگەر خۆت ناسـی کە تۆ بەندەیت سـەیر دەکەیت هەرچی لەسـەر زەویدا دەژێت بەندەیە، ئەو کات بیر دەکەیتەوە باشـە بۆ بەندەیکی وەک خۆم بکەم بە خوا، کێ لە بەندەکان سکی پر پیسای نەبێ تاوەک بیکەم بە خوا، کێ لە بەندەکان دوو دەسـتی لە من زیاترە، دوو چاوی لە من زیاترە تاوەک بیکەم بە خوا، بۆیە ئەم جۆرە بەندایەتیە سەرەتای کە مالێتی ئەقڵە، سـەرەتای کە مالێتی خوا پەرسـتیتە، سـەرەتای کەمالێتی ئیخلاصتە، سەرەتای کەمالێتی دوعاکانتە، کاتێک کە دوعا دەکەیـت پەروەردگـار وەڵامـت نـاداتەوە لەبەر ئەوەی دەبێ دوعـا لە دڵێکی ئەوەندە فەقیر و ئەوەندە بە زەلیلی دەربچێت، وەک ابن قیم

﴿رحمه الله﴾ دەفەرموویـت: گەورە ترین هۆکـاری دوعـا زەلیلی و خزوعـه. کاتێک کە دوعا دەکەیت دەبێ لە قیمەی فەقیردا بیت، وەک خوای پەروەردگـار ﴿جل وعلا﴾ دەفەرمـوویـت: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١﴾ ســوپاس بۆ تۆ پەروەردگارم کەوا ئەم قورئانەت دابەزاندە بۆ ســەر بەندەیەک، نەی فەرموو بۆ ســەر محمد بۆ ســەر ڕەسولێک بۆ سەر نەبییەک. هەر کەسێکیش پێی خۆشە ئەم قورئانە ببێتە شــیفای بابێتە بەندەی خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾، ســوێند بە گەورەی خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ بەقەدەر ئەوەی کە بزانیت بەندەیت کردەوەیشــی پێبکەیت ئەم قورئانە دەبێتە شــیفای دڵت ئەم قورئانە دەبێتە بەهـاری دڵـت دەبێتە ڕەحمەت بۆ دڵـت، بەڵام ئەوانەی کە مەغروورن ئەوانەی کە خۆبەگەورەزانن خۆیـان ئەبەنە ئـاســتی خوای پەروەردگار تەســلمی خوای زەوی و ئاســمانەکان نابن ســوود لەم قورئـانە وەرنـاگرن، بۆیە ابن قیم ﴿رحمه الله﴾ دەفەرمووێـت: یـاســای دروست بونت یا سای ئیمان و تەقوات یا سای کەمالی ئەقڵ و عیلم و ژیانت یاســای ئیســلاحی دڵت یاســای چاکی و پاکی ئەقڵ و کردەوەکانت ئەوەیە کە تۆ دەبێ بەندە بی بۆ خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ نەک بۆ جگە لە خوا. پاشــان ابن قیم ﴿رحمه الله﴾ دەفەرمووێت: (کمال

العبد وصلاحه يتخلف عنه من أحد جهتين ) ئینسان له دوو حاڵەتدا له دوو کاتدا لەدوای ئەوەی بەندایەتی کرد و تەسلیمی خوای پەروەردگار ﴿ﷻ﴾ بوو بەڵام نەگەیشــە پلەی ئیمانی تەواو نەگەیشــە پلەی تەقوای تەواو نەگەیشــە عیلمی تەواو ئیلا دوو جەهل و دوو هەڵەی تێدایە بۆیە ئەو کەمالییەی بە نیسب نەبووە،

سیفاتی یەکەم: (إما أن تكون طبيعته يابسة قاسية غير لينة ولا منقادة ولا قابلة لما به كمالها وفلاحها) یەکەم خاڵ کە خەڵکی زۆربەی ئەمڕۆ وایە بە تایبەت گەنجەکان خاوەن دڵێکی ڕەقە خاوەن تەبعێکی وشکە خاوەن قسەی وشکە خاوەن بیرکردنەوەیەکی وشکە خاوەن بیروباوەڕێکی وشــکە بۆیە قەد خوای گەورە پلەی کەمالی پێنادات، بەڵام کەســانێکیش هەن کە زانی تەبعی وشــکە تەبعی ســەقەتە بەم تەبعە ناتوانێ لە خوای پەروەردگار ﴿ﷻ﴾ نزیک بێتەوە نایشــتوانی خوا لە خەڵک نزیک بکاتەوە ناتوانێت ئەم دینە بە خەڵکی بگەیەنێت نایشــتوانێ دینی خوا بکاتە دڵی خۆی و خەڵکی ئیلا دەبێ ئەم تەبعە وشــکە واز لێ بهێنێــت بێتە ســەر ئەو تەبعەی کە خوای پەروەردگار ﴿ﷻ﴾ پێی ڕازییە، وەک ابن قيم ﴿رحمه الله﴾ دەفەرمووێت:
(إما أن تكون طبيعته يابســة) تەبعێکی وشــکی هەیە یان دڵێکی وشکی هەیە هەتا ژن و ماڵ و منداڵی لێی بێزارە هەتا چواردەوری لێی

بێزاره هەتا نەفسەکەیشی لێی بێزاره لەبەر ئەوەی ئەوەندە کەسێکی دڵ ڕەق و بۆگەنە بۆیە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ﴾ئەی محمد تۆ بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە نەرم و نیانیت، ئەگەر کەسێک خوای گەورە رەحمی لێی کرد نەرم و نیان دەبێ، هەر کەس کە نەرم و نیان نەبوو بـا بگری لەبەر ئەوەی خوا ڕەحمی لێی نەکردووە بە تـایبەت لەگەڵ ژن و منـداڵی لەگەڵ دایـک و بـاوکیـدا لەگەڵ خوشک و براکانی، هەر کەسێکیش نەرم نەبێ لەگەڵ نەفسی خۆی لەگەڵ غەیری خۆیشی نەرم نابێ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەرم ترین تەبعی هەبوو بۆیە گەورەترین ئینسـانە لەسـەر زەوی، ئەو کەسـانەی کە بیرکردنەوەیان وشـکە تەبعیان وشـکە نەخۆیان کامل دەبن نە دەتوانن خەڵکیش کـامـل بکەن، وەک دەفەرمووێـت: (ولا منقادة ولا قابلة لما به كمالها وفلاحها) ملکەچ نابێ بۆ ئەو ڕێگایەی خوای گەورە دای نـاوە و بۆی دانـاوە، خوای گەورە فەرمـانمـان پێ دەکـات ئەگەر دەمـانەوێـت بەنـدەیەکی کـامـل بین دەبێ لەسـەر مەنهەجی پێغەمبەری خوا بین ﴿ﷺ﴾، لەسـەر تەبعێکی نەرم و نیان بین، چاو لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بکەین لەسـەر دڵە نەرمەکەی لەسـەر قسـە نەرم و نیانیکەی بۆیە دەبینین وشـترێک هەسـت بە رەحمەتی

دەکات دار خورمایەک هەست بە رەحمەت و نەرم و نیانیکەی دەکات، پاشـــان ئەو کەســـەی کە ئەیەوێت دڵ نەرم و ملکەچ بێ ، ئەیەوێت کـامـل بێـت دەبێـت بەنـدەیەکی ملکەچ بێ خوا بۆ شــەریعەتی خوا بەتـایبەت بۆ ڕەوشـــتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، ئەو مەلکەچیە وای لێ دەکات کەمال و سەرکەوتوبێ،

سـیفاتی دووەم: لە سـیفاتە ناشرینەکان ڕێگری دووەم کە ئەو بەندە نابێتە ئیماندار و موســڵمانێکی تەواو، نەخۆی بە کامل دەزانێ نا خەڵکیش بە کامل دەزانێ نە ئەبێتە موسڵمانێکی سەڵاح و چاک نە خەڵکیشــی پێ چاک دەکرێت، وەک ابن قیم ﴿رحمه الله﴾ لە ڕێگری دووەم دەفەرمووێت: (وإما أن تكون لينة منقادة ســلســة القياد، لكنها غير ثابتة على ذلك، بل سريعة الانتقال عنه كثيرة التقب) یان دەبینی ئەم بەندەیە نەرمە تەبعیشـــی نەرمە وە لەهەمان کاتیشــدا هەوڵی داوە تەبعیشـــی نەرم بێت بەڵام جێگر نیە لەســـەر دینی خوا ســـەبری نیە لەسـەر لااله الاالله سـەبری نیە لەسـەر ئەو تەبعە نەرمەی سـەبری نیە لەســـەر ئەو دڵە نەرمەی، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بۆ چارەســـەری ئەم تەبعە دەفەرمووێـت: (یا مقلـب القلوب ثبـت قلبي على دینـك) ئەی پەروەردگارە دڵم ڕاگیر بکە لەســـەر دین، لەســـەر تەبع و بیرکردنەوەی نەرم لە سەر ئەقڵێتی و کاری نەرم لە سەر ئیسلامی و عیبادەتی نەرم،

بۆیە ابن قیم ﴿رحمه الله﴾ دەفەرمووێـت: (وإمـا أن تكون لينـة منقـادة سلسة القياد)، کەسێکە بە ئاسان رەفتاری لەگەڵ دەکرێت بە ئاسان بانگ دەکرێت بە ئاسـان قسـەی لەگەڵ دەکرێت بەڵام جێگیر نیە لەسەر دین، بەهۆی هۆکارێکی دنیای بە ئاسانی واز دەهێنێت لەسەر نوێژی لەسـەر دعوەی لەسـەر ئیخلاصـی لەسـەر تەوەکولی لەسـەر یەقینی لەسـەر سـەدەقەی لەسـەر عیبادەتی، پەشـیمان دەبێتەوە لە زاتی خوا لە بەهەشــتەکەی لە جەهەنمەکەی لە نیعمەتەکـانی، ابن قیم ﴿رحمه الله﴾ دەفەرمووێت: (لكنها غير ثابتة على ذلك،) بەڵام بەردەوام نیە لەسـەر چاکە (بل سريعة الانتقال عنه كثيرة التقب) زۆر بەخێرای ڕائی دەگۆڕێـت ئەقیـدەی دەگۆڕێـت ئەخلاقی دەگۆڕێـت کرین و فرۆشــتنی دەگۆڕێت وەفای دەگۆڕێت هەموو شــتێکی دەگۆڕێت، ئەمە یەکێکە لەو ئافاتانەی تر کە توشــی دەبێت کەوا دەکات ئەو بەنـدەیە ئەقلی کـامـل نەبێ ئیمان و تەقوای کـامـل نەبێ ئەمەیش یەکـێـکە لە ســیـفـاتەکـانی مـوبتـەدیـع، وەک ابـن قـیـم ﴿رحمه الله﴾ دەفەرمووێـت: گەورەترین ســیفـاتی موبتەدیع دوێنی موحیـد بوو ئەمڕۆ موشریکە دوێنی ســونە بوو ئەمڕۆ بیدعە چیە دوێنی ئەهلی ئیخلاص بوو ئەمڕۆ ئەهلی ڕیـایە دوێنی ئـازا بوو ئەمڕۆ ترســنۆکە دوێنی ئەهلی قیـامەت بوو ئەمڕۆ ئەهلی دونیـایە، ئەمە یەکێکە لە

سیفاتە زۆر ترسناکەکان زۆر لە ناو خۆمان ڕوودەدا، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زۆر پەنای بەخوای گەورە دەگرت لەم سیفاتە، پاشان ابن قیم ﴿رحمه الله﴾ دەفەرمووێت: (فمتى رزق العبد انقيادا للحق وثباتا عليه فليبشر فقد خير وذلك فضل اللّٰه يؤتيه من يشاء) هەرکاتێک خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ ئەم سیفاتەی بە ئینسان دا کە خاوەن تەبعێکی نەرمە خاوەن قسەیەکی نەرمە ئەو ڕێگایانەی گرتۆتە بەر کە هۆکاری ناجات و کامالێتیە وە خاوەن ئەقڵێکی ثابتە خاوەن ئەقڵ و ئەقدە و بیروباوەڕێکی جێگیرە، (فمتى رزق العبد انقيادا للحق وثباتا عليه فليبشر فقد خير وذلك فضل اللّٰه يؤتيه من يشاء) هەر کاتێک خوای گەورە ئەو سیفاتە جوانەی دابە ئینسان ملکەچی کرد بۆ حەق ملکەچی کرد بۆ قورئان، وەک خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ دەفەرمووێت:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ ئەو کەسانەی لە ژنان و پیاوانی ئیماندار گوێڕایەڵی هەموو فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بکەن بۆیان نیە ئیختیاری ئەو فەرمانانە بکەن بەویستی خۆیان، ئەگەر بەندە گەیشتە ئەو مەلکەچیە و جێگیر بوو

لەســەر مەنهەجی خوای گەورە، خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ لە پلەی ئەو کەسانە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ٣٠﴾ کاتێک کە مەلائیکەتی رووح کێشــان دێت بۆ لایان مژدەی بەهەشتی خوای گەورەیان پێ دەدات، **(وثباتا عليه فليبشــر)** ئەوا بـا مـوژدەی خـۆش وەربـگرن ئەو مژدەیە وەربـگرن کە لە دنـیا بەنـدەیەکـی ئـاقـل و کـامـل و ســاڵـحـن، وەک پەروەرگـار ﴿جل وعلا﴾ دەفەرموو ێت: لە قیامەتیشــدا ئەو مژدەیە دە یانگرێتەوە، ئیتر ئەو بەندەیە لە هەموو دەرگایەکی خێر دەبینرێت، لە هەموو شــوێنێکی خێر دەبینرێت، خەڵک کە دەیبینێت خێری بیردەکەوێتەوە، کە دەیبینێ قسەی هەر خێرە، کردەوەی هەر خێرە، دانیشتنی هەر خێرە، ڕۆشتنی هەر خـێرە، هەمـوو کـارێـکی دەبـێتە خـێر ئەم جـۆرە کەســە، بـۆیە پێغەمبەری خوا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەفەرمووێت: **(إن من الناس مفاتيح للخير مغاليق للشــر، وإن من الناس مفاتيح للشــر مغاليق الخير)** خوای گەورە خەڵکانێکی درووســت کردوە کلیلی خێرە، خەڵکانێکی تریشــی درووســت کردوە کلیل و دەرگای شــەرە، کەســانێکیش هەیە کلیلی

خێرە دەرگای خراپە دادەخات، وە کلیلی شرە و دەرگای چاکە دادەخات ، خوای گەورە پەناماندات، خوای پەروەردگار ﴿جل وعلا﴾ یارمەتیمان بدات کە تەبعمان نەرم بێ کردەوە و دڵ و بیرکردنەوە و ئەقیدە و داعوەمان نەرم بێ بە گوێرەی قورئان و سونەت، وە ثەباتمان بداتێ لەسەر ئەو مەنهەجە پاکە کە قورئان سونەتە، هەر کاتێک کە اللّٰه ﴿جل وعلا﴾ سیفەتی نەرمی پێداین عوجب و ریا و کیبر نەمانگرێت لەسەر ئەو سیفەتەی کە هەمانە ئەوە فەزڵی اللّٰه یە ﴿جل وعلا﴾ ، هەرگیز عوجب نەمانگرێت لەسەر ثەباتمان بە لااله الا اللّٰه، لەسەر ئەخلاقمان لەسەر دینمان، بۆچی؟ (وذلك فضل اللّٰه يؤتيه من يشاء) لەبەر ئەوەی سیفات و رەحمەتی خوایە کە پێی داوین، هەرگیز بە مێشکمان نەیات بڵێین ئێمە باشترین لە فڵانە کەس، ئێمە لە پێشترین ئەبێ خەڵک لەبەرمان هەستێت و ڕێزمان لێ بگرێت، بۆیە ئەمە ببێتە ئەقیدەی دڵمان وەک پێغەمبەر سولەیمان ﴿عليه السلام﴾ فەرمووی: ﴿قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾ هەر شتێکم هەیە فەزڵ و رەحمەتی خوایە تاقیم دەکاتەوە کە سوپاس گوزار دەبم یان ناشوکور دەبم، هەر شتێکت هەبێ وەک بڵێیت: من سەیارەم هەیە، من ژنم هەیە، منماڵم هەیە، من ئیشم هەیە، من ئەقڵم هەیە، تێ گەیشتنی من باشترە لە

کەسێکی تر هەمووی فەزڵی اللە یە ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ ، وەک خوای گەورە ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ دەفەرموویت: ﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾ بە هەر کەسێکم بوێت دەی دەم، خوای پەروەردگاریش ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ پێی خۆشە بەندەکان نەرم بن بەندەکان تەبعیان وشک نەبێ، بیرکردنەوە و دعوە و لێکدانەوەیان نەرم بێ، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خەڵکی نەرم بێ بە تایبەت لەگەڵ خێزان و ماڵ و منداڵی و دایک و باوکیان وشک نەبێ، ئەگەر ئەم کەسە پێغەمبەریش بێ. وەک خوای پەروەردگار ﴿جَلَّ وَعَلَا﴾ بە پێغەمبەر دەفەرمووێت: ئەی محمد ئەگەر زمانت رەقبێ لەگەڵ خەڵکی ئەوا هەرچی خەڵکە لە چواردەورت لێت دووردەکەونەوە، بۆیە دەبینین بانگخوازی وا هەیە عیلمێکی زۆریشی پێیە بەڵام کەس مەیلی بۆ لای ناچێت، ئەمڕۆ خەڵکی هەموو بریندارە خەمی زۆرە کەسێکی وشک قسەیان بۆ بکات کە خۆیشیان بە هۆی ئازارەکانی ژیانەوە وشک بوونە بۆیە ئەم دوو وشکە بە ئاسانی دەسوتێت و لە ناو دەچێ،

**لە کۆتایدا دەڵێم:** یارەبی خوای گەورە ئەو عبودێتەی کە دات بە پێغەمبەرمان ﴿صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ﴾ و دات بە پێغەمبەر یوسف و ئەیوب ﴿عَلَيْهِ السَّلَامُ﴾ بێ بەشمان نەکەیت بە ئێمەیشی ببەخشی، خوای پەروەردگار ئەو

فەزڵەمان لەگەڵدا بکەیت ئەو ئەقیدەیە لە مێشکمان بچەسپێنی تاوەک بزانین بەندەین و سکمان پر پیسایە، هەرگیز بە مێشکمان و بە خەیاڵماندا نەیات کە بەبێ غەیری تۆ ئەتوانین بژین یان بۆ غەیری تۆ بژین، پەروەردگار ئاقیبەتمان خێر بکەی لە یەقین و دڵێکی ئامادە و خشوعەوە بە ئیزنی تۆ ئەفەرمووین: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ یارەبی خوای پەروەردگار وەک پێغەمبەر یونس ﴿عَلَيْهِ السَّلَامُ﴾ کە دەربازت کرد لە تاریکی سکی حوتدا پەروەردگار ئێمەیش لە تاریکای ڕیا و شوهرە و ترسنۆکی و خۆشویستنی دنیا و عوجب و حەسوودی دەربازمان بکەی بۆ ڕووناکی لااله الاالله بۆ ڕووناکی ئیخلاص بۆ ڕووناکی تەقوا و بۆ ڕووناکی تەوازوع و بۆ ڕووناکی قیامەتی و بۆ ڕووناکی کاروکردەوەی باش.



سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه وسلم

